بسم الله الرحمن الرحيم

## پێناسی کتێب

ناوی پەرتووك : تەنها پێغەمبەر

نـووسینـــــــی :  محسن شوانی

دیـــــــــزاین : عزالدین عبدالله

دارشتنی بەرگ : چاپخانەی گوڵ

نۆرەی چـــاپ : چاپی یەکەم ٢٠٠٩

تـــــــــیراژ : ١٠٠٠ دانە

٤٦٥٨١٥٤

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان

ژمارەی سپاردنی(٨٦)ساڵی (٢٠٠٩) دراوەتێ

بسم الله الرحمن الرحیم

سوپاس وستایشی بێ پایان بۆ بەدی هێنەری زەوی و ئاسمان، گردکاری جیهان ورزق ورۆزی دەری گشت گیانداران، لە قولآیی دەریاکان وبەرزی ئاسمانەکان، لەژێر بەردو تاریکایی ژێر زەمین و سەر چڵ و پۆپی دارەکان، هەرخۆی دروستی کردوون و ناوی نان وەك ئێمە بە ئومەتان، خودای ئیبراهیم ونوح عیساو موحەممەدی ئاخر زەمان. هەزاران سەلام ودروود بۆ گیانی خۆشەویست مێوانی ئاسمان. یاوەری جبریل و خۆشەویستی رەحمان وگشت پێغەمبەران.

هۆکاری کردنەوەی هەر کەناڵێك وگرتنە بەری هەر هۆکارێك بۆ ناساندن وپێناسەکردنی زاتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) خزمەت کردنە بە گشت مرۆڤایەتی، چونکە هاتن و بوونی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) رەحمەت وبەزەیی خودایە بۆ بەندەکانی.

ئێمەش بەو پەڕی خۆشحاڵی وسەربەرزی یەوە هەستاین بە دامەزراندنی ماڵپەڕی (پێغبەمبەر)، تاوەکو زمانی کوردی پشکی خۆی هەبێت لەم رەحمەتە هەروەك چۆن بەردەوام بێ پشك نەبووە.

دوای ساتەوەختێك لەسەر دامەزراندنی ماڵپەڕی (پێغەمبەر) لەسەر دەستی کەسانێك کە هەردەم خۆیان بە شەرمەندەو موقەسیر دەزانن دەرهەق بەو زاتە پیرۆزە، هەستان بە دامەزراندنی ئەم ماڵپەڕە بە زمانی کوردی بۆ زیاتر ناساندنی ئەم کەسایەتیە مەزنە تاوەکو گەلەکەمان زیاتر شارەزایی دەربارەی ئەم بەرێزە پەیدا بکات. هەر هەنگاوێك بۆ ناسینی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)، هەنگاوێکە بەرەو سەرفرازی و ئازادی دونیاو قیامەت، هەنگاوێکە بەرەو گەورەیی و لێبوردەیی، هەنگاوێکە بەرەو ئایندەیەکی گەشی ڕوون وئاشکرا.

ئا لێرانە دەڵێین هەروەك حاجی قادر كۆیی گوتویەتی:

" مەعلومە بۆچی حاجی مەدحت دەكا بەكوردی
تاكەس نەڵێ بە كوردی نەكراوە مەدحی باری"

ئێمەش دەڵێین مەعلومە بۆچی ئەم ماڵپەرە بە زمانی كوردی كرایتەوە، تاوەكو نەڵێن بە كوردی نەكراوە وەسفی (نەبی). مەدح وستایشی (پێغەمبەر) (درودی خودای لەسەر بێت) ئێمە مانان پێی گەورە دەبین هەروەك ئیمامی ئیبنو قەییم دەڵێت نزیك بوونەوە لە پێغەمبەر نزیك بوونەوەیە لە راستیەكان، وهەرچەند شوێنكەوتوویی (پێغەمبەر) درودی خودای لەسەر بێت بكەین ئەوەندە لە شەقام ومەركەزی هەق ومرۆڤایەتی نزیك دەبینەوە. وەك ئەركێكی ئەم ماڵپەڕە ئەمە بەرهەمی چوارەمە بە چاپی دەگەیەنێت دەربارەی (پێغەمبەر) درودی خودای لەسەر بێت، وبەپشتیوانی خودا لە ئایندەدا زیاتر بەرهەمەكانی ئەم ماڵپەڕە بە چاپ دەگەیەنین.

لەم دەرفەتەدا بە چاكمان زانی تیشكێكی كورت بخەینە سەر (هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر بە شیعر).

یەكێك لە تایبەتمەندیەكانی ئیسلام وەسەتیەت وئیعتدالە هەر بۆیەش مامەڵەی ئیسلام لەگەڵ گشت لایەنەكانی مرۆڤ مامەڵەیەكی مام ناوەندیە، خەڵكان تووشی هەڵچوون وداچوون دەبن وزوو هەڵوێست وەردەگرن و زووش پەشیمان دەبنەوە، بۆ نموونە ئافرەت بە دەست ئەقڵ وبیری مرۆڤ ئەو بەرو ئەو بەری پێ دەكرێت بەڵام هەڵوێست وبەرنامەی ئیسلام بۆ ئافرەت سەیركردنی بوو وەك مرۆڤ نەوەك بیكاتە خودا وبپەرسترێت یان گۆشەگیر بكرێت وبە

شتێکی پیس وناحەز سەیر بکرێت، بەڵکو مرۆڤە وەك هەر مرۆڤێکی تر لەگەڵ تێبینی کردنی تایبەتمەندی مێینەی خۆی، هەروەها فریشتە لە نێو هەندێك کەس

هەر باوەڕ پێکراو نیە، کەسانێکیش هەن فریشتەیان کردۆتە هاوەڵ و هاوبەشی خودا.

بەڵام فریشتە لە ئیسلام جۆرێکن لە بەندەکانی خودا بەڵام مەخەیەرو سەر پشك نین لە کردارەکانیان دا. ئیسلام هەڵوێستی بەرامبەر بە شیعر وشاعیران حوکمی موتلەق وعام نەبووە بەڵکو شیعر لە وشە پێکهاتووە چاکەکەی چاکەو خراپەکەیشی خراپە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێت:" إنما الشعر كلام مؤلف ، فما وافق الحق فهو حسن، وما لم يوافق الحق منه فلا خير فيه )" هاوکات پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) وەك هەر مرۆڤێکی هەست ناسك گوێبستی شیعر بووە وەسفی سحر وبەیانی شیعری کردووە، هەروەها پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێت) لە دوو شوێن دایك وباوکی خۆی بە قوربانی بەرامبەر کردووە یەکەمیان کاتێك (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس) تیری دەگرتە بێ باوەڕان، دووەمیشیان کاتێك (حەسسانی کوڕی سابت) هەجوی بێ باوەڕانی دەکرد، بەڵام لە کۆی گشتی هەروەك یاسایەکی نەگۆڕ شیعر نەبرایتە ئاستی نیگا وئیلهام.

گەورەترین گرفتی مرۆڤەکان لەوە دایە کە ناتوانێت شتەکان وەك پێویست لە جێگاو شوێنی شیاوی خۆی دابنێت. کەسانێك شاعیر بە چاوەش سەیر دەکەن وبەرامبەریشیان بەرزی دەکاتەوە بۆ ئاستێك کە شوێنی مرۆڤ نیە.

لەسەرەتای هاتنی ئیسلام شیعر راوەستانێکی کزبوونەوەیەکی بەخۆیەوە بینی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم چەند هۆکارانەی خوارەوە:

١- پـاراوی و ڕەوانبیـژی قورئـانی پـیرۆز گشـت عەرەبـەکانی سەرسـام کردبوو بەتایبەتی تر شاعیرەکان چونکە خاوەن ئەزموون بوون لـە

بەکارهێنانی وشە بـەڵام بینیـان ئـەوەیام لەئـەوەی خۆیـان ناچـێت و زۆر بەهێزترە.

٢- سەرقاڵ بوونی زۆرێك لـەشاعیرانی ئەوکاتە بـە لـەبـەرکردنی قورئـانی پیرۆز و بیرکردنەوە لـە وشەکان و ڕستەکانی.

٣- خـەریك بـوونی زۆری یـاوەران بـە چەسـپاندنی ئیسـلام وبەرپـەرچ دانەوەی کارە دوژمنکاریەکانی دژ بە ئیسلام دەکرا لـە لایەن عەرەبـە بـێ باوەڕەکان.

٤- بەرفراوان بوونی دەوڵـەتی ئیسلامی لـەسەر دەستی ئەوان.

٥- لـەلایەکی ترەوە ئیسلام نەهی لـە بەکارهێنانی وشەی ناڕێك ونابـەجێی کرد وەك گەورەکردنی گیانی دەمارگیری وناوهێنانی ئـافرەت بـە وەسـفی وکرداری خراپ و نەهێشتنی بەدرەوشتی و جنێو فرۆشتن و هاندانی شەڕی خێڵایەتی.

٦- لـەم لاشەوە چەند ئایەتێك دابـەزی بـۆ ڕەواندنـەوەی گومـانی شـیعر وشاعیر لـەسەر قورئان وپێغەمبەر (دروودی خودای لـەسەر بێت)، ئـەوەش قسـە کـردن نـەبوو لـەسـەر شـیعر وشـاعیر بـەڵکو روون کردنـەوەی حەقیقەتێك بوو کە پێغەمبەر(دروودی خودای لـەسـەر بێـت) شـاعیر نیـە وقورئانیش شیعر نیە خودای گەورە لـە قورئانی پیرۆز دەفـەرموێت: ﴿وَمَـا

عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلاَّ ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُبِينٌ﴾ سورەتی (الفاطر) ئایەتی (٦٨)، واتە ئێمە فێری شیعرمان نەکردووەو، بۆشی نیە شاعیر بێت چونکە ئەوە

پێغەمبەرەو ئەوەی بۆمان ناردووە زیکر وقورئانی بەیانکاری راستیەکانە. ﴿وَالشُّعَرَاءُ يَتَّبِعُهُمْ الْغَاوُونَ، أَلَمْ تَرَى أَنَّهُمْ فِي كُلِّ وَادٍ يَهِيمُونَ، وَأَنَّهُمْ يَقُولُونَ مَا لاَ يَفْعَلُونَ، إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَذَكَرُوا اللَّهَ كَثِيرًا وَانتَصَرُوا مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا وَسَيَعْلَمُ الَّذِينَ ظَلَمُوا أَيَّ مُنقَلَبٍ يَنقَلِبُونَ﴾ سورەتی الشعراء. لەم ئایەتە کاتێك وەسفی هەموو قسە کردنێك بەشوێن هەموو بڵندگۆیەك کەوتن دەداتە پاڵ شاعیران لەگەڵ ئەوەش ئەوەانە باوەڕدارن و لەوانی جیا کردۆتەوە، چونکە باوەڕداران ڕێزی وشە دەگرن وخەریکی کردەوەی چاکن. لەم ئایەتەش رەواندنەوەی سیفەتی شاعیرە لە پێغەمبەر(دروودی خودای لەسەر بێت) وجەخت کردنە لە پێغەمبەرایەتی (محمد) (دروودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێت: ﴿إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ، وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ قَلِيلاً مَا تُؤْمِنُونَ، وَلاَ بِقَوْلِ كَاهِنٍ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ﴾ سورەتی الحاقة.

دیارە بێ باوەڕەکان زۆر بە جیددی وکار لەسەرکردن ویستویانە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) بکەن بە شاعیر قورئانیش لەبەرامبەر بە ئەوان نەفی ئەم هەڵبەستراوانەی کردووەو بواری نەداوە بۆیان بچێتە سەر چونکە ئەم قسەیە پێچەوانەی راستیەکانە هەروەك لەم ئایەتەشدا هاتووە کە دەفەرموێت:

﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَجْنُونٍ، بَلْ جَاءَ بِالْحَقِّ وَصَدَّقَ الْمُرْسَلِينَ﴾ الصافات .

ژیاننامەی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێت) پڕە لەم راستیانە وئەم راستیانەش حاشا هەڵنەگرن، دواتریش کاتێك دەوڵەتی ئیسلام سەقامگیر بوو وسنوورەکانی پارێزراو بوون لە هەموو دەست درێژیەك،

بینیمان کەوەك چۆن شیعر بووە بەشێکی گرنگ وکاریگەر لە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی، زۆربەی زاناو داناکان دیوانی شیعریان هەیەو، تا کۆشکی میر وخەلیفەکان پڕ بوو لە شاعیران، لە یادیشمان نەچێت گشت شاعیرانمان دەرچووی حوجرەکانی کوردستان کە هەموویان پەروەردەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامن، ئیسلام پێی گەیاندوون.

ئەڵێرانە جەخت لەسەر شتێك دەکەمەوە ئەویش شیعر کەمێك کز بوو بەڵام بوونی هەر هەبوو لە موراعات کردنی ماوەو دەرفەت و بێ زیادەڕۆیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) خۆی گوێ بیستی شیعر بووە تا شیعرەکانی کە بە سەردەمی جاهلی دەناسرێت، دواتر ئەبو بەکری سدیق وعومەری کوڕی خەتتاب و عوسمان وعەلی رەزای خودایان لەسەر بێت، چەندین جار لە کۆڕو مەجلیسەکانیان شیعریان گوتووە.

**عبداللطيف ياسين**
سەرپەرشتیاری ماڵپەری پێغەمبەر

## پەیام بەر

**خۆشەویستم**
**ئەی سەروەرم**
**ئەی ئاوێنەی راستەقینەی خواپەرستی**
**ئەی رابەرم،**
**لەفەرهەنگی گشت دونیادا**
**گەڕام ..گەڕام**
**بۆ ووشەیەك پربە بالأت،**
**پڕبە سۆزومیهرو جوانیت،**
**پڕ بەعیشقی خودا وویستییت**
**ماندووشەکەت گەڕامەوە**
**لەپەیامی تەعالەدا**
**دۆزیمەوە**
**لێی نوسرابوو:**
**(وانك لعلى خلق عظيم)**

## شەفاعەت

لەیەك دلۆپە باران دا
دەریایی میهرو....
بەخشندەیت دەخوێنمەوە
لەئۆقیانوسی بەزەیت
زۆردەترسم
بەنەزانی گوزەر بکەم
تورەییتم بیر چێتەوە
لەم سەفەرە
دونیەوییە ماندووە دا
فریای خەونێکی بەهەشتی
چەند چرکەیەك
بەدی ناکەم
چ جای بۆنی خۆشی میسك و
دیداری تۆ و

فیردەوس و پێغەمبەرەکەم
رۆژێ پەنجەرەی دۆزەخ
لەرووی خۆم دا دەکەمەوە!
رۆژێ دەگەم بەجەنەت و
بەهاوەڵان شاد دەبمەوە

ساتێ ترس و.....
ساتێ شادی....
من لەنێوان
دوو بازنە دا دەخولێمەوە
لە ئاکامی ئەم گەشتەدا
بە ئومێدی شەفاعەتی
موستەفامە
رەزامەندی پەروەردگار
بسێنمەوە.

١٦-٢-٢٠٠٨ مەخموور

## پەیامی موحەممەد

تەنیا پەیامی سەروەر ڕەوانە
ئارامی دڵ وڕێبازی ژیانە
دیاری وبەخششی پاکی یەزدانە
ڕێ نیشاندەری دونیاودینمانە

ئەوەی بەرنامەی ئەو بگرێتە بەر
سەرفرازئەبێ لەرۆژی مەحشەر
ئەوەی پێغەمبەر بکاتە رابەر
قەد گومڕانابێ وهەردەم بەختەوەر

نەهامەتیەکان کەئەمڕۆزۆرن
خەڵکی تێ ی کەوتوون نازانن چۆنن
دیارە سەرچاوەی کێشەوگرفتن
دوورە پەرێزی لەپەیامبەرن

تاكو كورد لەگەڵ ئیسلام ئاشنابێ
سەركردەی ڕۆحی هەر موحەممەد بێ
بێ شك دەگاتە ئامانج ومەبەست
نابێتە بەندەی دوژمنان ودۆست

٢٠٠٨/٣/٢٠

## خەدیجەی كوبرا

بم بەخشە
ئەی شۆڕە ژنی شاری مەككە
بم بەخشە ئەی گەورەژنی
هۆزی قوڕەیش
داوێن پاكی
لەپاك پاكتر...
ئەی ئاوێنەی خۆشەویستی
(خۆشەویستم)
خۆم وشیعروپێنووسەكەم
شەرمەندەنە
كەناتتوانن لەئاست بەرزیت شعرێ بڵێن
ئەی شاژنی ڕەوشت بەرزی
دەستە خوشكی دایكی( عیسا)
بەرزتری تۆ لە(ئاسیا)

ئەی پەناگەی
رەسولی من....
ئەی هاوسەری
ئەشرەفی مەخلوقاتی خوا
ئەی ئەو کەسەی

دوای بینیی جوبریلی پاك
دوای بیستنی
یەکەم ووشەی پەیامبەری
لەدوای غارا
یەکەم ئامێز...
یەکەم موژدە...
یەکەم باوەڕی جارڕدا
گەورەی ژنان
پشتیوانی سەروەرەکەم
دایکی زەهرا.

٢٠٠٧/٤/٢١

مەخموور

## پێغەمبەر

ئەی ئەو کەسەی لەهەمووکەس باشتری بۆم
خۆشمت دەوێ وخۆشم ئەوێ ی زیاترلەخۆم
بەپەیـــــــــــام وریبازی تۆ دێم ودەڕۆم
ئەی سەروەرم چەندتامەزرۆی دیداری تۆم



## دیداری خودا

یائیلاهی
هەرچەند ئەکەم بۆم ناژمێردرێن
بەخششی تۆ...
ئەو تەمەنەی پێت بەخشیوم
لەکڕنۆش بم
هەرگیز ناگات بەئاستی یەك
داوە برۆ
چی هەیە لەم بونەوەرە
داروبەرد وخاك وخۆڵ و..
زەوی وئاسمان....
پەری ومرۆ
بڕوادارین یا پەیڕەوی ئیبلیسن کۆ
بەقەد دەنکە خورمایێکیش
کەم ناکاتن لەمولکی تۆ
فیرعەونەکان هەرچەند زۆر بن

سوود وزیان ناگەیەنن بەعەرشی تۆ
یائیلاهی
لەفیردەوسا پێم ببەخشە
دوا بەخشش و
دیداری پڕ بەرزو شکۆ

٢٠٠٧/١٠/٧ مەخموور

## پێشوازی خودا

بەخۆرئاوابوونی ئەمڕۆ
دڵ تەنگ مەبن ،
من ئەزانم تاریکایی
لەدیرۆکی دیدی ئێوە
مێژووی ڕەشە!
شەو ترسانەلەوونبوونی ڕووناکیدا!
ئەمشەوچرای ماڵەکانتان
داگیرسانی پێویست نییە !
ئەمشەو مانگ وئەستێرەکان
لەپێشوازی میوانێکدان
لەشەوانی وەرزی ساڵدا
زۆر گەشترن .....
موژدەدانە
بەقەد باڵای ئاسمانی ژوور

نووربارانە،
خۆرمیوانی شەوە ئەم شەو!
خۆرلەم شەوەخۆی دەسوێ و
تیشك وجوانی بەردەکەوێ ....
فریشتەکان لەژمارە تێپەڕترن

بۆپێشوازی
لەکڕنۆش وپەرستنن
دەم بەخەندەوزیکرویادی
پیرۆزترن
ئەمشەو ئێمەش
تاسپێدەی تەمەن ماوە
فریای نۆرەی گەنجینەیك
پڕلەمیهرو بەخشندەیی
ئەمشەو کەوین

کڕنۆشێکی ئەبەدی بەین
سڕینەوەی گوناهی پڕشەرمەزاری
ئەمجارەشیان لەدەست نەدەین
ئەمشەولەگەڵ ئاوابوونی
دواتیشکی خۆر
ئاسوودەیی دابەش دەکرێ

بەختەوەری بۆئەوکەسەی
ئێشگ دەگرێ
تا ئەوساتەی (پەروەردگار)
تەشریف دێنێ .

٢٠٠٧/٩/١٩

## سەفەری ڕۆح

پێش ئەوەی بێن
لەگەڵ خۆتان خۆشەویستی ومیهرەبانی
بەسەر خاك ومەملەكەتی
کوردەواری ببارێنن
سەفەرێکی رۆحی بۆلای سوکنایی دڵ
بڕیاردەدەم
پێش ئەوەی بێن
(گابانی کورد)
وەکو نوێنەر
بۆپێشوازیتان دەنێرم
هاتووم تاوێ لەپاڵ کەعبە
کڕنۆشێکی بەندایەتی
بۆ خوابەرم
هاتووم لەگەڵ هاوەڵانی دارولئەرقەم

وانەکانی ئەم پەیامە
بەنهێنی لەپێغەمبەرم وەگرم
هاتووم پێتان ڕابگەیەنم
دەنگی دەروونی میللەتێ
هاتووم ئێوە

چنگێکی پڕ لەتوڕەیی
هاوارێکی ناخ گڕگرتوو
حەزی ڕق و
ئارەزووەسەرشێتەکەم
دامرکێنن
هاتووم شەوێ
لەباوەشی حەڕرای پڕنوور
لەدیداری دوودڵداری
ئەودیوسنووڕرابمێـــــنم
ماچی ووشەی (اقرأ)بکەم
ئامێزیکی بەخشندەیی
لەوشەوانەی دوای نەمان و
بەسەرچوونی
کاتی خەوتن
لەدوانیوەی شەوی تاریك
گوێ لەدوعاو پەرستشی

سەروەر بگرم
هاتووم پەندووئامۆژگاری
ئەبوبەکری هاوڕێی ڕێگای
ژین ومردنتان وەرگرم
لەنهێنی پشتیوانی

گەورەی ژنان
لەخەدیجەی خۆشەویست و
هاوسەری پاك
من تێبگەم
هاتووم فێری وانەی وورەوخۆراگری
خاوەن ووشەی (احد)ببم
ببمە فەرشی بەردەم ریگا
دڕکەکانی
ژنەسەرشێتەکەی ئەبولەهەب لابەرم
هاتووم لەدامرکاندنەوەی
ڕقی گەورەی کوڕی خەتاب
لەڕووخساری پڕلەڕێچکەی
ئەشك وترسی پەشیمانی
جەهالەتی پیاوماقولی
ئەوعومەرەڕابمێنم
هاتووم کەمێ

لەشەرمی پرڕێزی عوسمان
لای فریشتەی ئاسمانەکان
لای رەسول و هاوەڵانی
بەشانازی ..بەشەرمەوە
شەرم وبەخشینم بەرکەوێ

هاتووم دەستم بگا بەشمشێری عەلی
لەسوارچاکی..وئازایەتی..لەزانست و بەندایەتی..
لەرۆژانی پڕمەترسی..
لەئاژاوەی شەڕەکورسی..
خۆراگری وخۆنەوویستی
شەرع زان وخۆشەویستی
هاتووم..هاتووم
بڕوانم لەخواپەرستی
هاتووم جەهلی ئەبوجەهل و..
سەرشێتیەکەی ئەبولەهەب و
ڕقی ئەستووری موغیرەو
لات ومەنات وعوزا
خودای قوڕەیشیە نەزانەکان
ئەعرابیە پێ پەتیەکان
بناسێنم
هاتووم دەستێ

لەگەڵ دەستی فەتحی مەکە
سێ سەدو شەست
پتی کەعبە برووخێنم
دوای سەفەرم
ئینجاوەرن

مەملەکەتی ترس وتۆقین
نەتەوەی بن دەستی کیسرا
جاشی رۆستەم
لەژێرستەم دەربهێنن
ئێمەی کوردیش
بۆپێشوازی..
بۆرزگاری
باوەربەئیسلام دەهێنین

## ئیسلام

تۆنەیاساو
نە نووسراوەکانی حامورابی ،
نەپاشماوەی
سۆمەروکلدان وئاشوری ،نە ئاین و
نەشارستانیەتی رۆمی ،
نەکلتوری میدو ئاری ...
نە پەیڤەکانی زەردەشتی
کۆنە پێغەمبەری خۆمی ،
نەهۆنراوە هەڵواسراوەکانی
(ئومرەئولقەیسی )
نەشەریعەتی
کیسراومەقەوقیسی ....
تۆجیاوازی پەیڕەوانی
خاچ پەرستی ،
تۆ نەیاری ، نەوەی مەیموون ...

ئەسحاب سەبتی
تۆبەرنامەو دواپەیامی
تۆدیاری پەروەردگاری
تۆئاینی ئاشتی و.. یەکسانی و.. خواپەرستی .

## دایك

هۆ دایەگیان
شەوان چاوت ناچێتە خەو
تابەیانی ئێشکگری
بەدەم هەژان ولای لایەی
کۆرپە ئازیزەکەت دەگری
هۆدایەگیان
دڵت دەریای پڕلەمیهرو
بەخشندەیە
لەئامێزی تۆدانەبێت
ژیرنابێتن هیچ کۆرپەیێ
هۆدایەگیان
لەبەرامبەرسۆزی تۆدا
رۆحی پاکی
دایکایەتیت

چ پاداشتیێ شایستەتە
بۆیەبەهەشت
بەگەورەیی وبەپیرۆزی
لەژێر پێتە
هۆدایەگیان
لێم ببوورە
دوای تەمەنێ لەغوربەتی
هاتووم ساتێ
وەکوجاران
لەباوەشی بەزەییتا
ڕام هەژێنی!
هاتووم بڵێی لەتۆڕازیم
چونکە ئێستا
بەدەم سڕینی ئەسرینی
پەشیمانی عومر دەگریم

٢٠٠٧/٣/١١

## ڕەزامەندی

ئەی خودای تاك ،
بۆڕازی تۆوبەندایەتیم
بۆكڕنۆشیێ،
نوێژێكی پاك
بەفیدات بێ هەرچی هەمە
لەپیرۆزی
عیشق وجوانی
نەتەوەوخاك
٢٠٠٦/٩/١

## سروودی ،ڕێ ی خودا

ئێمە ڕێبواری ڕێی خوداین
خاوەن بڕواو،پشت وپەناین
پەیمان دەدەین ،پابەند دەبین
تەنیا بەندەی خودا دەبین
تاریکایی شەوەزەنگ و
سەختی ژیان وەلا ئەنێین
بەرەو ئاسۆ بۆبەختیاری
هەردوو دونیا هەنگاو ئەنێین
بۆ رزگاری وبرایەتی
ئیسلام بوون کوردایەتی
ئەم کاروانە تاسەر دەڕوا
دادپەروەری وکاری ڕەوا
ڕبردوومان ،کاری ئێستاو
نەخشەی نوێ ی دوارۆژمان

ئاسوودەی گەل ووڵات،
خزمەت کردن مافی ژیان
ئێمە هاتووین مژدەوچرای
رووناکیمان لەدەست دایە
دەستێ پێنوس، دەستێ ئاشتی

ئازادیمان لەگەڵ دایە
سەرداری مرۆڤایەتی
رزگارکەری بەندایەتی
موحە ممەدە پێشەوامان
ئیسلامە بیروبڕوامان
گەیاندنی ئەم پەیامە
پەیڕەوکردنی بەرنامە
ئاواتمان ئاوەدانیە
ئەرکمان جێ نشینیە
ئێمە ڕێبواری ڕێ ی خوداین
ماندوو نەناس براو تەباین
ئەگەر مردین ئەگەر ژیاین
ڕووسووری دوا رۆژو دونیاین

٢٠٠٦/١١/٢٠

مەخموور

## بوون

من مێژووی باوە ئادەمم
دەنگ ورەنگ و
سیمای ئەوم ،
من بەرهەمی درەختی بەهەشت و
ئاوی کەوسەروزەم زەمم
لەوەتەی هەم
بەدوای راستیدا دەگەڕێم
بێ ناسنامە..بێ پاسەپۆرت
لەو ولات ولەو شارو دێم
من هەڵگری پەیامێکم
من پەروەردەی قورئانێکم
من لەبوونی نەبوونێکم
من جێگری هەبوونێکم
بۆیە بوونێك

شایستەیە بۆ هەبوونێك .

## سروودی ئەی موحەممەد

ئەی موحەممەد ئەی پێغەمبەر
ئەی شەفیعی رۆژی مەحشەر
هەتا لەدونیا بمێنم
ناوی تۆهەردەم دەهێنم
تۆروناکی موسڵمانی
نوری چاوی هەمووماني
تۆ پێشەوای ئەبوو بەکری
بۆعەلی عومەر ڕابەری
بۆهەمزەو بۆسەعدی وەقاس
پاڵەوانی شەڕی بەدری
تۆماماۆستاوتۆبەشیری
تۆسەرکردەو تۆنەزیری
شافیعیی رۆژی مەحشەری
لەسیڕات لەکەوسەری

## هەردێیتەوە

هەردێیتەوە
دڵنیامە هەردێیتەوە
ئەمڕۆیاخود ساڵێکی تر
بەئاشکرا ، بەنهێنی
لەمینبەری مزگەوتەکان ....
لەسەرپەڕی رۆژنامەکان
وانەکانت دەڵێیتەوە
ئێستاش دەرگای مزگەوتەکان
چاوەڕوان ولەسەر پشتن
بۆدیدارو بۆدیدەنت زۆر پەرۆشن
میحرابەکان خولیاو
مەستی بۆنی تۆنە
مەئموومەکان چاوەڕوانی
(راست راوەستن –ئیستەقیمو )

دەنگی تۆنە
دڵنیامە هەردێیتەوە
چونکە ئەتۆ کۆمەڵێکت جێهێشتووە
دوای پێنج نوێژەنووسراوەکە
دوعاو نزا دەڵێنەوە

هەردێیتەوە
چونکە ئەتۆ لەنێومانی
لەخەیاڵ ولەخەومانی
لەپارشێوو
لەسەر خوانی
لەگشت بۆنەو یادەکانی
لەنێوپرسەو ئاهەنگمانی
هەردێتەوە
چونکە ئەتۆ موسڵمانی
راستگۆوپاکی
خۆشەویستی خواناسانی
بەئاشکرا
بەنهێنی
لەنێودڵی کوردستانی

## كۆچ

**یەكەم ووشەی**
**پەرتووكی من لەحەڕرابوو ،**
**كاتێ مرۆڤـــ لەگێژاوی نەزانین و...**
**لەگومڕابوو ....**
**جوبریلی پاك**
**كە سروشی بەتۆ گەیاند**
**( لات وعوزا ) ی لەنێو دڵی**
**هەزار قورەیش بێ شك ڕماند**
**ئەم ئیسلامە سەرنەكەوتوو**
**جێگیر نەبوو لەنێو دڵان**
**تا كۆچ نەكرا**
**موهاجیرو ئەنسارەكان نەبوونە برا.**

## حبل اللّٰه

لەوەتەی هەم من دوولەتم
بێ خودان ودەست بەرداری
سەد دەرفەتم
بۆیە ئێستا بێ ناسنامەو
بێ ئاشیان ومەملەکەتم !
من ئەزانم بەچی کەوتم
من دەستگرتەی سێ چوار پەتم !
جارێ لاشەم لەسوورئەنێن
کۆمەنیستم ناولێ ئەنێن
جارێکی تر دیموکراسی
هەربەووتەودەنگ وباسی
جارێکی ترنوێ خوازی
مافی ئافرەت جنس بازی
ئەم جارەیان

وەرن وەرن برایەتی ...
یەك نەتەوەی كوردایەتی ...
بۆدوا جاریش
درۆی زلی تیرۆریستی
دوور كەوتنەوە لەئاین و خوداوویستی .

## ڕێبازی موحەممەد

كاروان دەڕواو بەڕێوەیە
ئەم سەردەمە سەردەمێكی
بەپەلەیە
ئەم جیهانە وەك گوندێكی
بچكۆڵەیە
زانست لەوپەڕی لووتكەیە
چاونەترس و
شارەزانە
ڕێبوارانی ئەم ڕێگەیە
بادەست گرین بەم پەیامە
هەردێتەوە ئەم ئیسلامە
ئاگاداربن !
چەند ئیبلیسێ لەبۆسەنە
بەڕێوەنە

بۆنەمانی ئەم ڕێبازی مەحەممەدە
ئەبو جەهل و
وەلیدی بن مەغیرەنە .